# شەست و سێ فەرموودە

## گوڵزارێک لە فەرموودەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

## بۆ هەموو ئاستەکان



چاپی یەکەم

٢٠١٢

# شەست و سێ فەرموودە

گوڵبژێرێک لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم)

بۆ هەموو ئاستەکان

ناوی کتێب:- شەست و سێ فەرموودە

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی:- محەمەد عیزەت عەبدولقادر

نەخشەسازی بەرگ و ناوەوە:- ئامادەکار

چاپ:- چاپی یەکەم

ژمارەی سپاردن:- لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکان

١٨٩٩ ی ساڵی ٢٠١١ ی پێدراوە.

# پێشەکی

کاتێکی زۆر بیرم دەکردەوە کە بتوانم فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) کۆبکەمەوە لە نامیلکەیەکی بچوکدا و بۆ هەموو ئاستەکان ببێت و هەموو کەسێك بتوانێت سوودی لێوەرگرێت، هۆکاری دەست کردن بە ئامادەکردنی ئەم نامیلکەیە ئەوە بوو بتوانم کە پوختەیەك لە کورتترین و پڕواتاترین فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) ی تێدا کۆ بکەمەوە بۆ ئەوەی ئێمەی موسوڵمان زیاتر لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) تێبگەین.



## فەرموودە لەسەر بیر و باوەڕ و ئیمان

**فەرموودەی یەکـەم:-** عَنْ أَنَسِ ابْنِ مَالِكٍ (رضـــي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وســـلم): (**لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَلَدِهِ وَوَالِدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ**).

**(انس)(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (کەستان باوەڕی دامەزراوی نییە هەتا منی لەمنداڵەکانی و لەباوک و دایکی و لەهەموو خەڵکیش خۆشتر نەوێت).**

**فەرموودەی دووەم:-** عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه)، عَـــنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَـا يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُحِبَّ لِجَارِهِ ، أَوْ قَالَ: لِأَخِيـهِ، مَـا يُحِـبُّ لِنَفْسِهِ**).



(انس)(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، هیچ بەندەیەک ئیمانی نابێت هەتا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ دراوسێکەی . یافەرمووی بۆ براکەی پێی خۆش نەبێت).واتە: (ئیمانی تەواو نیە).

**فەرموودەی سێیەم:- عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْـــدِ الْمُطَّلِـــبِ (رضي الله عنه): أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صـــلى الله عليـــه وسلم) يَقُولُ: (ذَاقَ طَعْـمَ الْإِيمَـانِ مَـنْ رَضِـيَ بِاللّـهِ ربَّـا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا).**

(عباس) کوڕی(عبدالمطلب)(خوای لێ ڕازی بێت)دەڵێ: پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (تامی باوەڕی چەشتووە؛ ئەو کەسەی ڕازی بێت بەوەی کە خوا پەروەردگاری بێت، ئیسلام ئاینی بێت، محەمەد پێغەمبەری بێت).

**فەرموودەی چـوارەم:**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَـالَ: **(لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ لَا يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ).**

**(ابوهريره) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ناچێتە بەهەشت ئەوەی دراوسێکەی لەشەڕو خراپەی ئەمین نەبێت).**

**فـەرموودەی پێنجـەم:**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم):

**(لَـا تَـدْخُلُونَ الْجَنَّـةَ حَتَّـى تُؤْمِنُـوا، وَلَـا تُؤْمِنُـوا حَتَّـى تَحَابُّوا، أَوَلَـا أَدُلُّكُمْ عَلَـى شَـيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُـوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ).**

(ابوهریره)(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ناچنە بەهەشت هەتا ئیمان نەهێنن، ئیمانیش ناهێنن، هەتا یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر بیکەن یەکترتان خۆشدەوێت؟ سەلام لەیەکتری زۆربکەن).

**فەرموودەی شەشەم:**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه)، عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: (**لَا يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ**).

(ابوهریره) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئیماندار لەیەک کونەوە دووجار ناگەزرێت).

**فەرموودەی حەوتەم:**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): (**اثْنَتَانِ فِي**

النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ: الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ، وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ).

(ابوهريره)(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (دوو جۆر لەخەڵکی کوفرییان تێدایە، تانەو تەشەردان لەڕەچەڵەک وشین وشەپۆر لەسەر مردوو).

فەرموودەی هەشتەم:- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَ) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: (بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: عَلَى أَنْ يُوَحَّدَ اللَّهُ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَصِيَامِ رَمَضَانَ، وَالْحَجِّ). فَقَالَ رَجُلٌ: الْحَجُّ وَصِيَامُ رَمَضَانَ؟ فقَالَ: لَا، صِيَامُ رَمَضَانَ وَالْحَجُّ، هَكَذَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)).

(ابن عمر)(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ئیسلام لەسەر پێنج شت بنیات نراوە: خوا بەیەک بناسیت، نوێژ بکەیت، زەکات بدەیت، ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت، حەج بکەیت) پیاوێک وتی: حەج و ڕۆژووی ڕەمەزان؟ لەوەڵامدا وتی: نەخێر، ڕۆژووی ڕەمەزان و حەج، بەم شێوەیە لەپێغەمبەرم (صلی الله علیه وسلم) بیستووە.

**فەرموودەی نۆیەم:-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنـــه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وســـلم): (إِنَّ اللَّـهَ تبارك و تعالى تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي مَا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا، مَـا لَـمْ يَتَكَلَّمُوا أَوْ يَعْمَلُوا بِهِ)

(ابوهریرە)(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (خوای گەورەو بالادەست لەوشتانەی ئوممەتم دەبورێت کەبەخەیاڵیاندا دێت، مادام نەیڵێن یان نەیکەن).



**فەرموودەی دەیەم:**- عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رضـــي الله عنه) قَالَ: قالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم):

**(أَنَا أَوَّلُ شَفِيعٍ فِي الْجَنَّةِ، لَمْ يُصَدَّقْ نَبِيٌّ مِنَ الْأَنْبِيَاءِ مَا صُدِّقْتُ، وَإِنَّ مِنَ الْأَنْبِيَاءِ نَبِيًّا مَا يُصَدِّقُهُ مِنْ أُمَّتِهِ إِلَّا رَجُلٌ وَاحِدٌ).**

**(انس) کوڕی (مالک) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (من یەکەم شەفاعەتکارم لەبەهەشتا، هیچ پێغەمبەرێک بەقەد من خەڵک باوەڕی پێنەهێناوە لەناو پێغەمبەراندا، پێغەمبەر هەیە لەناو میللەتەکەیدا کەس باوەڕی پێنەهێناوە جگە لەیەک پیاو).**

## دەست نوێژ و پاك و خاوێنی

**فەرموودەی یانزەهەم:-** عَنْ أَبِي هُرَيْـــرَةَ (رضـــي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: (**اتَّقُـوا اللَّعَّانَيْنِ**). **قَالُوا: وَمَا اللَّعَّانَانِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (الَّذِي يَتَخَلَّى فِي طَرِيقِ النَّاسِ أَوْ فِي ظِلِّهِمْ).**

**(ابوهریرە) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (خۆتان بپارێزن لەو دوو نەفرەت لێكراوە)وتیان: ئەو دوو نەفرەت لێكراوە چین ئەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)؟ فەرمووی: (ئەوەی لەسەر ڕێگای خەڵكیدا پیسی دەكات، یان لەسێبەرەكانیاندا).[(كەجێگای دانیشتنی خەڵكە)].**

**فەرموودەی دوانزەهەم:-** عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنـــه) قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وســـلم) إِذَا دَخَـــلَ الْخَلَاءَ قال: **(اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبْثِ وَالْخَبَائِثِ).**

[illegible]

**بچوایەتە سەر ئاو دەیفەرموو: (اللهم إنی اعوذ بک من الخبث والخبائث).واتە: خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لەهەموو جۆرە پیسی و هەموو زیانبەخشێک لەشەیتان و جانەوەرو هەرشتێکیتر کەپیس و زیانبەخش بێت).**

**فەرموودەی سیانزەهەم:-** عن أَبو هُرَيْرَةَ (رضـــي الله عنه) قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وســـلم): **(إِذَا تَوَضَّــأَ أَحَـدُكُمْ فَلْيَسْتَنْــشِقْ بِمَنْخِرَيْــهِ مِـنَ الْمَــاءِ، ثُـمَّ لِيَنْتَثِرْ).**

(ابوهریره)(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەگەر یەکێکتان دەستنوێژی گرت با ئاو لەکونەلوتەکانی وەردات، ئینجا فن بکات).

**فەرموودەی چواردەهەم:-** عن جَابِر (رضي الله عنه) قال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: (**إِنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلَاةِ**).

(جابر)(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ : بیستوومە لەپێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (لەنێوان مرۆڤ و هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان و کوفردا نوێژ نەکردنە).

**فەرموودەی پازەنزەهەم:-** عَنِ عبدالله بْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: (**الَّذِي تَفُوتُهُ صَلَاةُ الْعَصْرِ كَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ ومالَهُ**).

(عبدالله) کوڕی(عمر) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەوەی نوێژی عەسری دەچێت هەروەکو ئەوەوایە ماڵ و خێزانی تالان کرابێت).

فەرموودەی شانزەهەم:- (مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ مَشَى إِلَى بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ، لِيَقْضِيَ فَرِيضَةً مِنْ فَرَائِضِ اللَّهِ، كَانَتْ خَطْوَتَاهُ إِحْدَاهُمَا تَحُطُّ خَطِيئَةً، وَالْأُخْرَى تَرْفَعُ دَرَجَةً).

(ابوهریرە) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (هەرکەس لەماڵی خۆیان دەستنوێژ بگرێت و پاشان بڕوات بۆ ماڵێک لەماڵەکانی خوا، بۆ ئەوەی فەرزێک لەفەرزەکان خوا ئەنجام بدات، هەنگاوەکانی یەکێکیان گوناهێک لادەبات، ئەوەیتریان پلەیەک بەرزی دەکاتەوە).

فەرموودەی حەڤدەهەم:- مَنْ بَنَى مَسْجِدًا لِلَّهِ بَنَى اللَّهُ لَهُ فِي الْجَنَّةِ مِثْلَهُ

(هەرکەس مزگەوتێک بۆ خوا دروست بکات خوا لە بەهەشتا بەوێنەی ئەوەی بۆ دروست دەکات).

**فەرموودەی هەژدەهەم:-** عَنْ زَيْنَبَ الثَّقَفِيَّةِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَ) قَالَتْ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): (إِذَا شَهِدَتْ إِحْدَاكُنَّ الْمَسْجِدَ فَلَا تَمَسَّ طِيبًا).

(زينب الثقفية) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووین: (ئەگەر ئافرەتێکتان ویستی ئامادەی مزگەوت بێت با بۆن نەدات لەخۆی).

**فەرموودەی نۆزدەهەم:-** الْبُزَاقُ فِي الْمَسْجِدِ خَطِيئَةٌ، وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا

(تف ڕۆکردن لەمزگەوت تاوانە، کەفارەتیشی شاردنەوەیەتی)

فەرموودەی بیستەم:- إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ. وَإِذَا خَرَجَ فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ).

ئەگەر یەکێکتان چووە ناو مزگەوت با بڵێ: (اللهم افتح لي أبواب رحمتك) واتە: خوایە دەرگاکانی ڕەحمەتی خۆتمان بۆ بکەرەوە، کاتێ چووە دەرەوەش با بڵێ: (اللهم اني اسالك من فضلك) خوایە گیان من داوای خێرو چاکەت لێدەکەم.

فەرموودەی بیست و یەکەم:- (خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا، وَشَرُّهَا آخِرُهَا. وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا، وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا).

باشترین ڕیزی پیاوان ڕیزی یەکەمە، خراپترینیشیان دواڕیزە، باشترین ڕیزی ئافرەتانیش دواڕیزیانەو، خراپترینیشیان یەکەم ڕیزیانە)
ئەگەر ئافرەت لەمزگەوت لەگەڵ پیاوان نوێژ بکەن، ئەگەر خۆیان بەتەنیا نوێژ بکەن، ئەوا ڕیزی یەکەم باشترە.

**فەرموودەی بیست و دووەم:- (لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ -وَفِي حَدِيثِ زُهَيْرٍ: عَلَى أُمَّتِي- لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ).**

**(ئەگەر لەسەر ئیمانداران لەڕیوایەتێکیتردا لەسەر ئومەتم قورس نەبوایە فەرمانم پێدەکردن کەسیواک بکەن لەگەڵ هەموو نوێژێکدا).**

**فەرموودەی بیست و سێیەم:- غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ، وَسِوَاكٌ، وَيَمَسُّ مِنَ الطِّيبِ مَا قَدَرَ عَلَيْهِ**

**خۆشتنی ڕۆژی جومعە لەسەر هەرکەسێکی باڵغە لەگەڵ سیواک کردن و چەندیش بتوانێت بۆنی خۆش لەخۆی بدات).**

فەرموودەی بیست و چوارەم:- لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الْجُمُعَاتِ أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ، ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ).

(ئەوانەی نوێژی جومعە ناکەن باواز لەو ڕەفتارەیان بهێنن یان خوا مۆری ڕەش دەنێت بەسەر دڵیانداو پاشان دەچنە ڕیزی غافڵانەوە).





**فەرموودەی بیست و پێنجەم:-** عن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): **(لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ).**

**(ابو سعيد الخدرى) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی:(لا الة الا الله بدەن بەگوێی مردووەکانتاندا). واتە: ئەوانەی کەلە سەرەمەرگدان.**

**فەرموودەی بیست و شەشەم:-** **لَأَنْ يَجْلِسَ أَحَدُكُمْ عَلَى جَمْرَةٍ، فَتُحْرِقَ ثِيَابَهُ فَتَخْلُصَ إِلَى جِلْدِهِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَجْلِسَ عَلَى قَبْرٍ).**

**(ئەگەر کەسێک لە ئێوە لەسەر پشکۆیەک دابنیشێت هەتا پۆشاکەکەی دەسوتێت و دەگاتە پێستی، هێشتا ئەوەی چاکترە لەوەی لەسەر گۆڕێک دابنیشێت).**



فەرموودەی بیست و حەوتەم:- لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ، أَوْ شَقَّ الْجُيُوبَ، أَوْ دَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ

(لە ئێمە نییە ئەوەی لە ڕومەتی خۆی دەدا یان یەخەی خۆی دادەڕێت، یاخود دەنگ و هاواری لێ بەرز دەبێتەوە وەک سەردەمی نەفامی).





فەرموودەی بیست و هەشتەم:- یَا نِسَاءَ الْمُسْلِمَاتِ، لَا تَحْقِرَنَّ جَارَةٌ لِجَارَتِهَا، وَلَوْ فِرْسِنَ شَاةٍ)

ئەی ئافرەتە موسڵمانەکان، باهیچ دراوسێیەک خێری ئافرەتە دراوسێکەی بەکەم نەزانێت، با ئەو خێرە بە ئەندازەی ئێسقانی باڵە مەڕێکیش بێت).

فەرموودەی بیست و نۆیەم:- الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَالْيَدُ الْعُلْيَا الْمُنْفِقَةُ وَالسُّفْلَى السَّائِلَةُ

دەستی سەرەوە چاکترە لەدەستی خوارەوە، دەستی سەرەوەی بەخشندە، دەستی خوارەوەی داواکار).

فەرموودەی سییەم:- (لَيْسَ الْغِنَى عَنْ كَثْرَةِ الْعَرَضِ، وَلَكِنَّ الْغِنَى غِنَى النَّفْسِ).

دەوڵەمەندی بە شتی زۆر نیە، بەڵکو دەوڵەمەندیی ئەوەیە کە دڵ و دەرون دەوڵەمەندبێت).

**فەرموودەی سی و یەکەم:-** عَنْ حُذَيْفَةَ (رضي اللهُ عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: **(كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ).**

(حذيفه) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (هەموو کردەوەیەکی چاک خێرە).

**فەرموودەی سی و دووەم:-** **(قَدْ أَفْلَحَ مَنْ أَسْلَمَ وَرُزِقَ كَفَافًا، وَقَنَّعَهُ اللَّهُ بِمَا آتَاهُ).**

(بەڕاستی ئەو کەسە سەرفرازە کەموسڵمان بووەو ئەوەندەی هەیە کەبەشی دەکات، خوایش ڕازی کردووە بەو بەشەی کەپێی داوە).

فەرموودەی سی و سێیەم:- إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثَةٍ: إِلَّا مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ).

(کاتێ کەسێک مرد دەست بەرداری هەموو کردارێک دەبێت، جگە لە سێ شت: خێرێکی نەبڕاوە و بەردەوام، یا زانستێک کە سوودی لێببینرێت، یا منداڵێکی باشی هەبێت نزای خێری بۆ بکات).

## رەمەزان و ڕۆژوو

**فەرموودەی سی و چوارەم:- إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ**

**کاتێ کە ڕەمەزان دێت دەروازەکانی بەهەشت دەکرێنەوەو قاپیەکانی دۆزەخ دادەخرێن و شەیتانەکان کۆت دەکرێن).**

**فەرموودەی سی و پێنجەم:-(تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السُّحُورِ بَرَكَةً).**

**پارشێو بکەن چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە).**

**فەرموودەی سی و شەشەم:-(مَـنْ نَـسِيَ وَهُـوَ صَـائِمٌ، فَأَكَـلَ أَوْ شَـرِبَ، فَلْيُـتِمَّ صَـوْمَهُ، فَإِنَّمَـا أَطْعَمَـهُ اللَّـهُ وَسَقَاهُ).**

**ئەوەی لەبیری نەبوو کە بەڕۆژوە و خواردن یان خواردنەوەی خوارد باڕۆژوەکەی تەواو بکات، چونکە ئەوە خوا خواردن و خواردنەوەی داوەتێ).**

**فەرموودەی سـی و حەوتـەم:- (أَفْـضَلُ الـصِّيَامِ بَعْـدَ رَمَضَانَ شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ، وَأَفْضَلُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَرِيـضَةِ صَلَاةُ اللَّيْلِ).**

**(گەورەترین ڕۆژو دوای ڕەمەزان ڕۆژووی مانگی (محرم)ە کە پێی دەوترێت (شهرالله المحرم) گەورەترین نوێژیش لەدوای نوێژەفەرزەکان شەونوێژە.**

**فەرموودەی سی و هەشتەم:-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيِّ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) سُئِلَ عَنْ صَوْمِ الِاثْنَيْنِ، فَقَالَ: (فِيهِ وُلِدْتُ، وَفِيهِ أُنْزِلَ عَلَيَّ).

(ابوقتادة) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): کاتێک دەربارەی ڕۆژوی دووشەموان لێیان پرسیوە ، فەرموویەتی: (من لەو ڕۆژەدا لەدایک بووم، لەو ڕۆژەشدا قورئان دابەزێنراوەتە سەرم). [واتە: بیگرن باشە]

**فەرموودەی سی و نۆیەم:-** عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ أَحْيَا اللَّيْلَ وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ، وَجَدَّ، وَشَدَّ الْمِئْزَرَ

## شەست و سێ فەرموودە

(عائشە) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم): کاتێ گەیشتە دەشەوی کۆتایی [ڕەمەزان] شەوگاری (بەخوا پەرستی) دەبردە سەرو، خێزانەکانی هەڵ دەسان و خۆی ماندو دەکردو پشتوێنی لێ قایم دەکرد.

## حەج و عەمرە

### فەرمودەی چل هەم:- لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ تُسَافِرُ مَسِيرَةَ يَوْمٍ إِلَّا مَعَ ذِي مَحْرَمٍ

بۆ هیچ ئافرەتێک نییە باوەڕی بەخوا و ڕۆژی دوایی هەبێت، ڕۆژە ڕێیەک بەبێ مەحرەم بڕوات).

**فەرموودەی چل و یەکەم:-** عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بيدي لِحُرْمِهِ حِينَ أَحْرَمَ، وَلِحِلِّهِ حِينَ حلَّ، قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ

(عائشە) هاوسەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) .دەڵێ: بەدەستی خۆم بۆنی خۆشم دا لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێش ئیحرام بەستن، لەدوای ئەوش کە ئیحرامی شکاند، پێش ئەوەی تەواف بکات بەدەوری بیتدا.

**فەرموودەی چل و دووەم:-** (صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِي غَيْرِهِ مِنَ الْمَسَاجِدِ، إِلَّا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ)

(أبـو هريـره) (خـوای لـێ ڕازی بێت) دەڵـێ: پێغەمبەر (صلى اللـه عليـه وسلم) فەرمویەتی: (نوێژێک لەم مزگەوتەی من دا خێرترە لەهەزار نوێژ لە مزگەوتەکانی تردا، جگە لەمزگەوتی حەرام).

**فەرموودەی چل و سـێیەم:-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): (**عَلَى أَنْقَابِ الْمَدِينَةِ مَلَائِكَةٌ، لَا يَدْخُلُهَا الطَّاعُونُ وَلَا الدَّجَّالُ**).

(ابـو هريـره) (خـوای لـێ ڕازی بێت) دەڵـێ: پێغەمبەر (صلى اللـه عليـه وسلم) فەرمووی: (لەسەر ڕێگاکانی مەدینە چەندەها فریشتە هەن، بۆیە تاعون و دەجال ڕووی تێ ناکەن).

**فـەرموودەی چـل و چـوارەم:-** **فَعُمْـرَةٌ فِـي رَمَـضَانَ تَقْضِي حَجَّةً أَوْ حَجَّةً مَعِي).**

(عەمرەیەک لەڕەمەزاندا جێی حەجێک یاخود حەجێک لەگەڵ مندا دەگرێتەوە).

## خۆراك و كڕین و فرۆشتن

**فەرموودەی چل و پێنجەم:- (مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلَا يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ)**

(هەرکەسێک خۆراکێکی کڕی تا وەری نەگرێت نەیفرۆشێتەوە)

**فەرموودەی چل و شەشەم:- (إِنَّ اللَّـهَ وَرَسُولَهُ حَـرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ وَالْخِنْزِيرِ وَالْأَصْنَامِ).**

(خوداو پێغەمبەرەکەی مەی و مردارەوەبوو بەراز و بتیان حەرامکردوە)

**فەرموودەی چل و حەوتەم:- إِيَّاكُمْ وَكَثْـرَةَ الْحَلِـفِ فِـي الْبَيْعِ، فَإِنَّهُ يُنَفِّقُ ثُمَّ يَمْحَقُ).**

نەکەن زۆر سوێند بخۆن لەمامەڵەدا، چونکە سوێن خواردن برەو بەشتەکە دەدات بەڵام فەڕ و بەرەکەتی لێهەڵدەگرێت).

**فەرموودەی چل و هەشتەم:- مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُنْجِيَهُ اللَّهُ مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلْيُنَفِّسْ عَنْ مُعْسِرٍ، أَوْ يَضَعْ عَنْهُ).**

هەرکەس حەزدەکات خوا لە کۆسپ و تەنگەرەکانی ڕۆژی قیامەت ڕزگاری بکات باپەلە لەقەرزداری نەدار نەکات، یا یا لەقەرزەکەی ببورێت یالێی داشکێنێت.

## خواردن و خواردنەوەکان

**فەرموودەی چل ونۆیەم:-كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ).**

(هەر خواردنەوەیەک مرۆڤ سەرخۆش بکات ئەوە حەرامە).

فەرموودەی پەنجا هەم:- الَّذِي يَشْرَبُ فِي آنِيَةِ الْفِضَّةِ إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ).

(ئەو کەسەی لە دەفری زیودا بخواتەوە، ئەوە ئاگری دۆزەخ لەناوسکیدا قوڵتە قوڵتی دێت

فەرموودەی پەنجا و یەکەم:- لَا يَشْرَبَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ قَائِمًا، فَمَنْ نَسِيَ فَلْيَسْتَقِئْ).

باکەستان بە پێوە خواردنەوە نەخواتەوە، هەرکەسێ لەبیری چوو با برشێتەوە).

فەرموودەی پەنجا و دووەم:- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى أَنْ يُتَنَفَّسَ فِي الْإِنَاءِ.



(أبو قتادة) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕێگری کردووە کە فووبکرێت بە دەفری خواردن و خواردنەوەدا.

فەرموودەی پەنجا و سێیەم:- إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَأْكُلْ بِيَمِينِهِ، وَإِذَا شَرِبَ فَلْيَشْرَبْ بِيَمِينِهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ).

هەرکاتێ یەکێکتان خواردنی خوارد بابەدەستی ڕاستی بیخوات، هەرکاتێ ئاوی خواردەوە بابە دەستی ڕاستی بیخواتەوە، چونکە شەیتان بە دەستی چەپی دەخوات و دەخواتەوە).

فەرموودەی پەنجا و چوارەم:- إِنَّ اللَّهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الْأَكْلَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا، أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا

شەست و سێ فەرموودە

خوا لەوبەندەیە ڕازی دەبێ کە هەر خواردنێکی خوارد سوپاسی خوای لەسەر بکات، یان هەر خواردنەوەیەک بخواتەوە و سوپاسی خوای لەسەر بکات).

فەرموودەی پەنجا و پێنجەم:- كُلُّ ذِي نَابٍ مِن السِّبَاعِ فَأَكْلُهُ حَرَامٌ).

(هەموو دڕندەیەکی کەڵبەدار خواردنی حەرامە)

## ئادابەکان

**فەرموودەی پـەنجا و شەشـەم:- تَـسَمَّوْا بِاسْـمِي وَلَـا تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي).**

**(بەناوی منەوە ناوبنێن، بەڵام بەنازناوەکەوە نازناو مەنێن).**

**فەرموودەی پەنجا و حەوتەم:- (إِنَّ أَحَبَّ أَسْمَائِكُمْ إِلَى اللَّهِ: عَبْدُ اللَّهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ).**

**(خۆشەویسترین ناوتان لای خوا (عبدالله) و (عبدالرحمن) ە).**

فەرموودەی پەنجا و هەشتەم:- خَمْسٌ تَجِبُ لِلْمُسْلِمِ عَلَى أَخِيهِ: رَدُّ السَّلَامِ، وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ، وَإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ، وَعِيَادَةُ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعُ الْجَنَائِزِ.

(موسڵمان پێنج ئەرکی براکەی لەسەرە: وەڵام دانەوەی سەلام، دۆعای خێر بۆ پژمیو، چوون بەدەم دەعوەتەوە، سەردانی نەخۆش، شوێن کەوتنی جەنازە).

إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَةً فَلَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الْآخَرِ حَتَّى تَخْتَلِطُوا بِالنَّاسِ، مِنْ أَجْلِ أَنْ يُحْزِنَهُ

ئەگەر ئێوە سێ کەس بوون، با دوانتان نەکەونە چپەکردن جیالەویتر، هەتا تێکەڵ دەبن بەخەڵکانیتر، چونکە ئەوکەسە دڵگران دەبێت).

## بەهەشت

**فەرموودەی پەنجا و نۆیەم:-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ:

**فەرموودەی شەستەم:- (يَدْخُلُ الْجَنَّةَ أَقْوَامٌ أَفْئِدَتُهُمْ مِثْلُ أَفْئِدَةِ الطَّيْرِ)**

**(أبو هريرە)(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (کۆمەڵێک دەچنە بەهەشتەوە دڵیان وەک دڵی باڵندە وایە).**



فەرموودەی شەست و یەکەم:- أَهْلُ الْجَنَّةِ فِيهَا وَيَشْرَبُونَ، وَلَا يَتَغَوَّطُونَ، وَلَا يَمْتَخِطُونَ، وَلَا يَبُولُونَ، وَلَكِنْ طَعَامُهُمْ ذَاكَ جُشَاءٌ كَرَشْحِ الْمِسْكِ، يُلْهَمُونَ التَّسْبِيحَ وَالْحَمْدَ كَمَا تُلْهَمُونَ النَّفَس).

بەردەوام بەهەشتیەکان لەبەهەشتا دەخۆن و دەخۆنەوە، نە پیسایی دەکەن نە چڵمیان هەیە و، نەمیز دەکەن، بەڵکو پاشەڕۆکی خواردنیان جۆرە قرقێنەیەکە بۆنی هەر لە بۆنی میسک دەچێت. سوپاس و ستایشی خوا دەکەن وەک چۆن ئێوە هەناسە دەدەن).

فەرموودەی شەست و دووەم:- (مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ يَنْعَمُ لَا يَبْأَسُ، لَا تَبْلَى ثِيَابُهُ وَلَا يَفْنَى شَبَابُهُ).

(هەر کەس بچێتە بەهەشتەوە هەمیشە بەهرەمەند دەبێت و تەنگژیانیی بەسەردا نایەت، نەجلوبەرگی کۆت و داڕزاو دەبێت و نەتافی لاویشی بەسەر دەچێت).

**فەرموودەی شەست و سێیەم:-** عَنْ عَبْدِ اللَّـهِ بْـنِ مَسْعُودٍ (رضي الله عنه) قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللّـهِ (صلى الله عليـه وسـلم): أَيُّ الْعَمَـلِ أَفْـضَلُ؟ قَـالَ: (الـصَّلَاةُ لِوَقْتِهَا).

**(عبدالله) کوڕی (مسعود) دەڵێ: پرسیارم کرد لەپێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کام کار زۆر چاکە؟ فەرمووی : (نوێژ لەکاتی خۆیدا)**

**لە کۆتاییدا:-**

**سوپاس بۆ خوا توانیم لە ئامادەکردنی ئەم نامیلکەیە ببمەوە و هیواداریشم بە نووسینی ئەم نامیلکەیە سوودێک بە خۆم و ئێوەی بەڕێزیش بگەیەنم، خوا بیخاتە بەر پاداشتی دوا ڕۆژمان.**

**لە دوعای خێر بێ بەشمان مەکەن**

سەرچاوە:

- صەحیح موسلیم
- مختصر صەحیح موسلیم - زکي الدین عبدالعظیم بن عبد القوي المنزري.
- www.dangiislam.org
- برنامج ( سابات فەرموودە )

لەم کتێبەدا چەندین فەرمووده لە دەربارەی (بیر و باوەڕ و نیمان، دەست نوێژ و پاک و خاوێنی، مردوو و گۆڕ، خێرکردن و زەکات، ڕەمەزان و ڕۆژوو، حەج و عەمرە، کڕین و فرۆشتن، خواردن و خواردنەوەکان، ئادابەکان، بەهەشت) ئامادە کراوە .




لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە سپاردنی ١٨٩٩ ی ساڵی ٢٠١١ ی پێدراوە